# ئاگاداربوون لە (٤٦) تاوانی گەورە



کورتەیەک لە

کتاب الكبائر للإمام الذهبي

والكبائر للشيخ محمد بن سليمان التيمي

وەرگێڕانی :

باوکی ڕەیان

چاپی یەکەم ١٤٢١هـ

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهديه الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادی له وأشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد ان محمداً عبده ورسوله ، اما بعد فان أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدى هدي محمد صلى الله عليه وسلم وشر الامور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ظلالة وكل ظلالة فى النار .

خوای پەروەدگار دەفەرموێت ﴿ إن تجتنبوا كبائر ما تنهون عنه نكفر عنكم سيئاتكم وندخلكم مدخلاً كريماً ﴾ و ئەمە بەڵێنە لەلایەن خوای گەورەوە کەهەر کەسێك خۆی بپارێزێت لەو تاوانە گەورانەی کە خوای گەورە فەرمانی کردووە بەدوور بین لێی دەفەرموێت لەتاوانەکانی تری خۆش دەبم ، بەڵام بەومەرجەی کە ئەو تاوانە گەورانە نەکەین ئەمەش ڕەحم وبەزەیی یەکی خوای پەروەدگارە بۆ بەندەکانی ، هەروەها دەفەرموێت ﴿ الذين يجتنبون كبائر الأثم والفواحش الا اللمم ، ان ربك واسع المغفرة ﴾ کەواتە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ئەو تاوانە گەورانە بناسێت تا خۆیی بەدوور بگرێت لێی ، تا ئەو تاوانە نەبێتە هۆی لێ نەخۆش

بوونــی خــوای گــەورە ، وە پێغەمبــەریش ﷺ ئاگــاداری بەدووركەوتنی لەو تاوانە گەورانـە كردوویـن و دەفـەرموێت ﴿ الصلوات الخمس والجمعة الى الجمعة كفارة لما بينهن ما لم تغش الكبائر ﴾ مسلم و الترمذي . واتە : ( پێنج نوێژەكـەو نێوانی هەینی بۆ هەینی داهاتوو لێ خۆش بوونە بەمەرجێك تاوانی گەورەی تیادا نەكرا بێت ) .

وە لەم نوسراوەدا ئەو تاوانە گەورانە ناهاتووە بۆ ئەوەی هەموو موسڵمانێك شارەزا بێت و ئەو تاوانە بناسێت تاوەكو خۆیـی لـێ بپارێزرێت ، پاشان داوا لەخوای گەورە دەكـەین ئێمە و هەموو موسڵمانێك بپارێزرێت لەتاوان و خراپەكاری وە تەوفیقمان بدات بۆ هەموو ئەو كارانەی پـێی خۆشـەو پـێی ڕازییە وە ئەم نوسراوەش ببێتە هۆیەك بۆ ناساندن و خۆپاراستن لەو تاوانانەوە پاداشتی خەیرمان بداتەوە پـێی وە بەدوورمان بگرێـت لـە ڕیـا كـردن و لەهەموو موسڵمانان خۆش بێت .

( وصلى الله وسلم وبارك على محمد وعلى أله وصحبه وسلم )

**ئەمەش ئەو تاوانە گەورانەیە کە دێت ان شاء اللە :-**

## ١- هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە

خوای گەورە دەفەرموێت ( انه من یشرك بالله فقد حرم الله علیه الجنة ومأواه النار ) واتە : هەر کەسێك هاوبەش بڕیاربدات بۆ پەروەردگار ئەوا خوای گەورە بەهەشتی بێ حەرام کردووە وە جێی مانەوەی و حەوانەوەی دۆزەخە .

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿ الا أنبئکم باکبر الکبائر ؟ الا شراك بالله ﴾ متفق علیه و واتە :( ئایا هەواڵتان بدەمێ بەتاوانە گەورە گەورەکان ؟ هاوبەش بڕیاردان بۆ پەروەردگار وە هاوبەش بڕیار دان بۆ پەروەردگار دوو جۆرە : هاوبەش بڕیاردانی گەورە کە ئەمیش سەرف کردنی پەرستشەکان بۆ غەیری خوایان سەرف کردن هەر شتێك لە پەرستەکان بۆ غەیری پەروەردگار ، دووهەمیان : هاوبەش بڕیاردانی بچوك کەڕیاکردنە ، خوای گەورە لە فەرموودەی ( قدسی) دا فەرموویەتی ﴿ انا أغنی الشرکاء عن الشرك من عمل عملاً اشرك معي فیه غیري ترکته وشرکه ﴾ رواه مسلم .

## ٢ـ کوشتنی نەفسێکی حەرام کراو

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ومن يقتل مؤمناً متعمداً فجـزاؤه جهنم خالداً فيها وغضب الله عليه ولعنه وأعد له عذاباً عظيمـاً ﴾ واتــه: ( هــەر کەسـێك بـاوەڕدارێك بەقەسـت بکوژێـت پاداشتەکەی دۆزەخە و بەهەتا هەتایی تیایدا دەمێنێتەوە و خوای گەورە غەضەب و لەعنەتی لێ دەکات وە سزایەکی زۆر سەخت و گەورەی بۆ ئامادە کردووە ) و وەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ اجتنبوا السـبع الموبقـات الشـرك بـالله ، والسحر ، وقتل النفـس التـى حـرم الله .. ﴾ واتـه: ( خۆتـان بپارێزن له حەوت تیا بەرەکە ، هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا ، جادووکوشتنی نەفسێك که خوای گەورە حەرامی کردووە. )

## ٣ـ جادوو

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ولكـن الشـياطين كفـروا يعلمـون النـاس السـحر ﴾ جـادوو بـەدەقی ئایـەت و فـەرموودە بـێ بـاوەڕی و کوفـرە وە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت ﴿ اجتنبـوا السبع الموبقات الشرك بالله ، والسحر وقتل النفس التى حـرم الله الا بـالحق . ﴾ فەرموودەکـەی پێشـترە کـە باسمـان کـردووە یەکێك لەو تاوانە تیابەرانە جادووە .

## ٤ ـ تەرك كردنی نوێژ

خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ فخلف من بعدهم خلف اضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غياً الا من تاب ﴾ وات : لەپاش خۆیان نەوەیەكیان جێ هێشت نوێژیان تیا بردو شوێن ئارەزوو كەوتن ، دەگەن بە ( غياً )[1] مەگەر ئەوانە نەبێت كە تەوبە دەكەن لێی ) ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەو كەسانەی كەواز لە نوێژ كردن دێنن دەچنە ناو دۆزەخەوەو توشی سزایەكی گەورەو سەخت دەبن ، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة ، فمن تركها فقد كفر ) رواه احمد والترمذي والنسائي

وە فەرمودەكەش ئاماژە بەوە دەكات كە هەر كەسێك نوێژ تەرك بكات كوفری كردووە ، بۆیە دەبێت موسڵمان ئاگاداری نوێژەكانی بێت .

## ٥ ـ نەدانی زەكات

نەدانی زەكات یەكێكە لەتاوانە گەورەكان و بكەرەكەی لەسەری سزا دەدرێت ، وە پەروەردگار بەڵێنی سزای

---

[1] (غياً) شوێنێكە لە دۆزەخدا

دۆزەخـــی داوە بـــەم جـــۆرە کەســـانە ، دەفـــەرموێت :
﴿ و ويل للمشركين الذين لايؤتون الزكاة وهم بالآخرة هـم كـافرون ﴾
واتە: نەدانی زەکات پیشەی هاوبەش کەرەکانە و یەکێکە لە ڕەفتارەکانیان ، وە پەروەردگار ووشەی ( وویل ) ی بۆ بەکار هێناون .

## ٦ـ نەدانی مافی دایك و باوك

خـوای گـەورە و میـهرەبان نـەدانی مـافی دایـك و بـاوکی داناوە بەیـەکێك لـەو تاوانـە گەورانـەی کـە مـرۆڤ بەهۆیـەوە دوور دەبێت لە ڕەحمی خوای گەروە ﴿ وقضى ربـك الا تعبـدوا الا اياه وبـالوالدين احسـانا ، امـا يبلغـن عنـدك الكـبر احدهمـا او كلاهما فلا تقـل لهمـا اف ولا تنـهرهما وقـل لهمـا قـولاً كريمـاً ٭ واخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقـل رب ارحمهما كمـا ربيـان صغـــيرا ﴾ واتــە : خــوای پــەروەدگار دوای مــافی خــۆی کــە هاوبەش بڕیار نەدانە بۆی فەرمانی کردووە بـەمافی دایـك و باوك و ڕێـز گرتــن لێیـان وە بەڵگـە زۆرە لـەم بارەیـەوە بـەڵام ئـــەوەندە بەســـە کەئـــەم دوو فەرموودەیـــە بخەینـــە ڕوو ، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەی:﴿ الا انبئكم باكبر الكبائر؟..)دا یـەکێك لەتاوانـە تیا بـەرەکانی بـاس کـردووە بەنـەدانی مـافی دایك و باوك وە فەرموودەکەش ( متفق عليه ) یە وە هەروەها

فەرموویەتی: ( رضا الله في رضا الوالد و سخط الله في سخط الوالد ) الترمذی وابن حبان ، واتە : ڕەزامەندی خوا لە ڕەزامەندی باوکدایە و تووڕەبوونی خوا لە تووڕەبوونی باوکدایە ) واتە ڕازی بوونی خوا بەوەیە کە دایك و باوك ڕازی بکەیت لە خۆت وەنەدانی مافی دایك و باوك هۆی تووڕەبوونی خوای پەروەردگارە .

## ٧ـ زینا کردن

هەروەها تاوانێکی تری گەورە ئەوەیە کە زینا بکرێت خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا ﴾ خوا گەورە نەك ڕێگری تەنها کردووە لە زینا کردن بەڵکو لەو هۆیانەی کەنزیکت دەکاتەوە لەو تاوانە ، وەزینا کردن دەردی گەورەی پێوەیە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ اذا زنى العبد خرج منه الايمان ، فكان على رأسه كالظلة ، فاذا أقلع رجع اليه ﴾ رواه ابوداود والحاكم ، واتە: گەر کەسێك زینا بکات ، باوەڕ تیایدا دەردەچێت و وەك سێبەرێك بەسەرییەوە دەمێنێتەوە گەر وازی لێ هێناو دەست بەرداری بوو ئەوا دەچێتەوە ناوی واتە ، باوەڕەکە دەچێتەوە ناو دڵی ئەو کەسە .

## ٨ـ کاری ( لەواطە ) کردن

ئەم کارە پیشەی قەومی ( لوط) بوو وە خوای گەورە هەموویانی توشی سزا کردوو لەناوی بردن ئەم کارە زۆر زەرمەند و خراپە و هەر کەس ئەمە پیشەی بێت خوای گەورە لەعنەتی لێ دەکات و لەرەحمی خۆی بەدووری دەگرێت ، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أتأتون الذكر من العالمين و تذرون ما خلق لكم ربكم من ازواجكم بل أنتم قوم عادون ﴾ ، سزای سەخت بۆ ئەم جۆرە کەسانەیە بەو دۆزەخ جێیانە و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ لعن الله من عمل عمل قوم لوط ﴾ النسائي ، واتە ( خوای گەورە لەعنەتی کردووە لەوە شێوەی کاری قەومی ( لوط) ئەنجام دەدات ) بەلاَم ئێستا بەناوی ( دەستور ) ، (پەرلمان) ەوە بەناو یاسایەکیان دانوە تایبەتە بۆ کردنی ئەم کارە خوای گەورە تۆڵەیان لێ دەسەنێت .

## ٩ـ سوو خواردن

ئەمەش تاوانێکی ترە لەو تاوانە گەورەکان کەبکەرەکەی توشی سزای سەختی دۆزەخ دەبێت و خوای گەورە لە دونیادا سەرشۆڕو ڕیسوای دەکات ، پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ يأيها الذين أمنوا اتقوا الله وذروا ما بقي من الربا ان كنتم

مؤمنين فان لم تفعلوا فاذنوا بحرب من الله و رسوله .. ﴾ ئەو کەسەی خۆی بەباوەڕدار دەزانێت بادەست بەرداری خواردنی سوو بهێنێت گەر دەست بەرداری نەبێت ئەوە ڕێی داوە بەخۆی جەنگ و بەربەرەکانی دەکات لەگەڵ خوار پێغەمبەرەکەی ، وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ لعن الله أكل الربا وموكله) مسلم ، واته خوای گەورە لەعنەتی کردووە لە سوو خۆرو سوودەر ) .

## ١٠ـ خواردنی پارەی هەتیوو

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ان الذين ياكلون أموال اليتامى ظلماً انما ياكلون في بطونهم ناراً وسيصلون سعيراً ﴾ ئەوانەی سامانی هەتیوو بەستەم دەخۆن ئاگر لە سکیاندا دەخۆن و دەشکەن بە دۆزەخ و سزای ( سعير ) کە شوێنێکە لە دۆزەخدا ، وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ولا تقربوا مال اليتيم الا بالتي هي أحسن ﴾ هەروەك چۆن چاکەکردن لەگەڵ بێ بارك دا پاداشتی گەورەی هەیە لای پەروەردگاری بەهەمان شێوە ستەم کردن و خواردنی ماڵی هەتیوو سزایەکی ئێجگار سەخی هەیە .

## ١١ـ درۆ کردن بەدەم خواو پێغەمبەری خواوە

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ ویوم القیامة تری الذین کذبوا علی الله وجوههم مسودە ﴾ لە ڕۆژی قیامەتتدا ئەو کەسانە دەبینیت کە درۆیان بەدەم خواوە کردووە ڕوخساریان ڕەشە ، وەبێ گومان ئەو کۆمەڵەش سزایەکی سەختیان بۆ هەیە بەهۆی قسەکردنیان بەناوی خوای گەورە درۆکردنیان پێیەوە وە هەروەها درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ بکەرەکەی شوێنێك لە وئاگردا ئامادە دەکات بۆ خۆی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ من کذب علي متعمداً فلیتبوأ مقعده من النار ﴾ رواه البخاري ، وە زۆر بەناوموسڵمان ئەم خەصڵەتەیان تیادایە ، خوای گەورە بمان پارێزێت لێی .

## ١٢ـ خۆ بەزل زانین و فەخر کردن و خۆ بەدڵ بوون

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ انه لایحب المستکبرین ﴾ النحل ، وە خوای گەورە کەسانی خۆ بەزل زانەری خۆش ناوێت بێ گومانیش هەر کەس خوای گەورە خۆشی نەوێت شوێنی دۆزەخەو دوورە لە ڕەحمی خوای گەورە ، وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ لا یدخل الجنة أحد في قلبه مثقال ذرة من کبر ﴾ رواه مسلم ، خوای گەورە کەسێك ناخاتە بەهەشتەوە ئەگەر

مسقاڵە زەرەیەك خریەزل زانینی لەدڵی‌دا بێت ، ئەمەش بێ گومان لە تاوانە گەورەکانەو ئەم جۆرە کەسانەش بەهیچ شێوەیەك خوای گەورە نایان خاتە بەهەشتی ڕازاوەوە .

## ١٣ـ شایەتی درۆ

خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ فاجتنبوا الرجس من الأوثان واجتنبوا قول الزور ﴾ الحج (٣٠) ئەم کارەش پیشەی مروڤی خوا پەرست و باوەڕدار نی‌یە چونکە ئەمەش هۆی چوونە ناو ئاگرەوەیە و سزایەکی توندی پێوەیە ، وەلەفەرموودەیەکدا هاتووە ﴿ لاتزول قدما شاهد الزور يوم القيامة حتى تجب له النار ﴾ ابن ماجه والحاكم ، واتە : پێی خاوەن شایەتی درۆ ناجوڵێت لە قیامەتدا تاوەکو ئاگری بەموڵگا نەبێت و وەهەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە ﴿ الا أنبيئكم باكبر الكبائر ؟ الشرك بالله ، وعقوق الوالدين ، الا وقول الزور . فما زال يكررها حتى قلنا : ليته سكت ﴾ متفق عليه واتە : هەواڵتان بدەمێ بەتاوانە گەورەکان ؟ هاوبەش بڕیاردان بۆ پەروەردگار وەنەدانی مافی دایك و باوك ، وە ووتەی درۆ ، ڕاوی دەڵێت : هەردووبارەی دەکردەوە ئەوەندە تاوەکو ووتمان : خۆزگە بێ دەنگ دەبوو .

## ١٤ـ خواردنەوەی مەی

خواردنەوەی مادە بێ هۆش کەرەکان یەکێکە لەتاوانە گەورەکان و بکەری ئەم تاوانە جێی دۆزەخە و سزای توندی بەنسیب دەبێت ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ياايها الذين أمنوا انما الخمر والميسر والأنصاب والأزلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون ﴾ واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خواردنەوەی مەی و قومار کردن خۆ پاك کردنەوە بەئێسك کردەوەی شەیتانە خۆتانی لێ بپارێزن بەڵکو ڕزگارتان ببێت ، واتە لە دۆزەخ و سزاکەی .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ لعن الله الخمر وشاربها وساقيها وبائعها ومبتاعها وعاصرها ومعتصرها وحاملها والمحلولة اليه وأكل ثمنها ﴾ رواه ابو داود والحاكم ، واتە : خوای گەورە لەعنەتی کردوە لەمەیی و ئەکەسەی دەیخواتەوە و لەتێ کەری و لەئەوکەسەی دەیفرۆشێت و لەکڕیار کەری و لەدروست کەری و لەو کەسەی ئاوەکەی دەگرێت واتە وەکو شەربەت کەلەو جۆرە خۆراکە دەیفلیقێنێتەوە ، وەلە هەڵگری و لەو کەسەی بۆی هەڵ ئەگرێت ، وەلەبخۆری داهاتەکەی و

پارەکەی وە هەروەها دەفەرموێت ﴿ ولا یشرب الخمر حین یشربها وهو مؤمن ﴾ متفق علیه ، واتە ئەو کەسەی دەیخواتەوە لەو کاتەدا باوەڕدار نی‌یە.

## ١٥ـ قومار کردن

لەئایەتی پێش ووترا هات کە قومارکەیش توشی سزای سەختی خوایی دەبێت و قوماریش هەروەها یەکێکە لەو تاوانە گەورەکان و کە پێویستە مرۆڤ خۆی لێ بپارێزێت ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿انما الخمر والمیسر والأنصاب والأزلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه لعلکم تفلحون ﴾ .

## ١٦ـ تاوان بار کردنی ئافرەتە بێ تاوانەکان و مێردارەکان بەزینا کردن

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ان الذین یرمون المحصنات الغافلات المؤمنات لعنوا في الدنیا والآخرة ولهم عذاب عظیم ﴾ واتە : هەر کەسێك ئافرەتێکی خاوەن مێرداری بێ ئاگا لەو تاوانەو باوەڕدار بکات بە زینا کردن لەعنەتی لێ کراوە لە دونیا و قیامەتیدا وە لەرۆژی دواییدا سزایەکی گەورەی بۆ هەیە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ من قذف مملوکة بالزنا أقیم علیه الحد یوم القیامة الا ان یکون کما قال ﴾ متفق علیه ،

واته هەر کەسێك ئافرەتێکی خاوەن دلر تاوانبار بکات به زینا کردن حەددی خۆی لێ دەدرێت له ڕۆژی دواییدا مەگەر بەو شێوەیە بێت که ووتویەتی .

## ١٧ـ دزی

دزی یەکێکه له تاوانه گەورەکان که بکەرەکەی له قیامەتدا توشی سزای سەخت دەبێت خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ السارق والسارقة فاقطعوا ايديهما جزاء بما كسبا نكالا من الله والله عزيز حكيم ﴾ دزی پیاوو دزی ئافرەت دەستیان ببڕێن پاداشته لەوەی کەکردوویانه و ئەمه سزایەکه له خوای گەورەوه بۆیان وه خوای گەوره بەعیزەت و دانایه ، وەئەم کاره پیشەی باوەڕدار نی یه چونکه پێغەمبەر ﷺ ﴿ لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن ، ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن ﴾ متفق عليه . واته : زیناکەر که زینا دەکات لەکاتی زیناکردنەکەدا باوەڕدار نی یه ،وەدز کەدزی دەکات لەکاتی ئەو دزی کردنەدا باوەڕدان نی یه ، واته لەو کاتەدا باوەڕ له دڵی دا نی یه بۆیه ئەو کاره دەکات ، بەڵام بەردەوام بوونی و تەوبەنەکردن لێی بکەرەکه دەبات بەرەو سزای سەختی خوایی .

## ١٨ـ رێ گرتن ( چەتەیی )

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ انما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ويسعون في الارض فساداً ان يقتلوا او يصلبوا أو تقطع أيديهم وأرجلهم من خلاف أو ينفوا من الارض ذلك لهم خزي في الدنيا ولهم في الآخرة عذاب عظيم ﴾ واتە : ئەو کەسانەی کەبەربەرەکانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لەسەر زەوی دا پاداشتەکەیان دەبێت بکوژرێن یان دەست و پێکانیان ببڕێت(بەپێچەوانی) واتە ڕاست و چەپ ، یان دەبێت سەرو گوم بکرێن لەزەویدا ئەمانە و سەر شۆڕیان بۆ هەیە لە دونیادا وە لە ڕۆژی دواییدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە )

## ١٩ـ سوێند خواردن بۆ فێڵ و دەست برین

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ من حلف على يمين صبر ، يقتطع بها مال امرىء مسلم وهو فيها فاجر لقي الله وهو عليه غضبان ﴾ البخاری ، واتە هەر کەسێك سوێندێك بخوات ، وەئارام گربێت لەسەری بۆ پچڕاندنی پارەی موسڵمانێك و تیایدا تاوان بار بێت دەگات بەخوای پەروەردگار و لێی تورەیە )واتە کە دەگات بەخوای گەورە غەزەبی خوای لەسەرە .

## ٢٠ـ ستەم کردن

ستەم کردن بەخواردنی پارەی خەڵکی یان بە لێدانیـان یـان بەووتـەی نابەجـێ پـێیان یـان بەتـەعدا کـردن یـان چەوسانەوەی لاوازەکان ، خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ وسيعلم الذيـن ظلمـوا أيـي ملقلـب يلقلبـون ﴾ وە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێت ﴿ اتقوا الظلم فانه ظلمات يـوم القيامـة .. ﴾ مسلم واتـە : خۆتـان بپارێزن لەسـتەم کـردن چونکـە لـە ڕۆژی قیامـەتدا تاریکی‌یـە ) هـەروەها ئـەم تاوانـەش لەتاوانـە گەورەکانـە و موسـڵمان دەبێـت ئەمەشـی نـەبێت چونکـە دەرەئەنجام زۆر سامناکە ، خـوای گـەورە لـە قیامـەتدا هـەموو شتەکانت بۆ دەکات بە تاریکی .

## ٢١ـ خۆکوشتن

خۆکوشـتن لـە تاوانـە گەورەکانـە و بـاوەڕدار دەبێـت دوور بێت لەمە ،خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ لا تقتلوا أنفسكم ان الله كان بكم رحيما ، ومن يفعل ذلك عدواناً وظلمـاً فسوف نصليـه نـاراً وكـان ذلـك علـى الله يسرا ﴾ خـوای گـەورە دەفەرمووێت خۆتـان مەکوژن پەروەردگار بۆتـان بەبەزەیی‌یـە ، وەهەرکـەس بەستەم و ڕقـەوە ئەمـە بکـات ، دەیگەیـەنین بـە ئـاگر ، ئەمـەش لای

خــوای گــەورە ئاســانە ، وە پێغەمبــەر ﷺ دەفــەرموێت : ﴿ لعن المؤمن كقتله ، ومن قذف مؤمناً بكفر فهو كقاتله ، ومن قتـل نفسـه بشـيء عذبـه الله بـه يـوم القيامـة ﴾ متفـق عليـه ، واتـه لەعنەت كردن لە باوەڕدار وەكو كوشتنی وایە ، وەهەر کەس باوەڕدارێك بەكافر تاوان باربكات وەك بیكوژێ وایە ، وە هەر كەسێك خۆی بكوژێت بە شتێك خوای گەورە سزای بەو شتە دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا .

## ٢٢- درۆ كردن لە زۆرینەی ووتەدا

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ثم نبتهل فنجعل لعنة الله علـى الكاذبين ﴾ خوای پەروەردگار لەعنەت دەكات لـە درۆ زنـەكان ، وە پێغەمبــەر ﷺ فەرمویـەتی ﴿ .. وان الكــذب يــهدي الى الفجور ، وان الفجـور يـهدي الى النـار ، وان الرجـل ليكـذب حتــى يكتـب عنـد الله كذابـاً ﴾ متفـق عليـه، واتـه ، درۆكـردن سـەر ئەكێشێت بۆ تاوان باری وە تاوان باریش سەر ئەكێشێت بۆ چوونە ناو ئاگرەوە ، وەپیاو كە هـەر درۆ دەكات تاوەكو لای پــەروەردگار بــەدرۆزن دەنوســرێت وە درۆ كــردن پیشــەی مرۆڤی دووڕووە خوای گەورە بمانپارێزێت .

## ٢٣ـ حوکم کردن بەوەی غەیری خوا دایبەزاندووە

ئەمەش هەروەها تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ومن لم يحكم بما أنزل الله فاولئك هم الكافرون﴾ واتە ، هەر کەس حوکم بەوە نەکات کە خوای گەورە دایبەزاندووە ئەوە کافرە ، وەئەمە بریتی‌یە لەوەی کاربکەی بەشتێك لەغەیری ( قورئان ) و سونەت ) یان شوێن بەرنامەیەکی غەیری خوا بکەویت یان دۆستایەتیت هەبێت بۆی یان خۆشت بوێت ، ئەمانە هەمووی حوکم کردنە بەغەیری ئەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە .

## ٢٤ـ خۆ شوبهاندنی پیاو بەئافرەتانەوە وە خۆشبهاندنی ئافرەتان بە پیاوانەوە .

ئەمەش لەتاوانە گەورەکانە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ لعن الله المخنثين من الرجال ، والمترجلات من النساء ﴾البخاری ، واتە خوای گەورە لەعنەتی کردووە لەو پیاوانەی هاو شێوەی ئافرەتانن وە ئەو ئافرەتانەی هاوشێوەی پیاون ، ئەم تاوانە گەورەیە لەناو وڵاتەکەماندا زۆر بڵاوە تەنانەت لە رێگاوبان زۆر لە گەنجان دەبینین وەك ئافرەت وان وە هەروەها ئافرەتان کە پۆشاکی پیاوانە دەکەنە بەریان ئەمانە لەعنەتی خوای گەورەیان لێ کراوە .

## ٢٥ـ ( الدیوث ) ئەوە پیاوەیە بەتەنگ شەرەفی‌یەوە نی‌یە

الدیوث ئەو کەسەیە کە بەتەنگ شەرەفی‌یەوە نی‌یە و بەتەنگ خێزان و ماڵ و مناڵەکەیەوە نی‌یە و هیچ دەسەلاتێکی نی‌یە لەماڵەکەی دا وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ ثلاث لا یدخلون الجنة : العاق لوالدیه ، والدیوث ، ورجلة النساء ﴾ النسائی ، الحاکم ، واحمد ، واتە: ( سیان ناچنە بەهەشتەوە ، نەدەری مافی دایك و باوك ، وە دەیوث ، وەئافرەتانی خۆشوبهێنەر بە پیاوانەوە ) ئەم ڕەفتارە زۆر مەترسی دارەو خێزان بەرەو بێ سەرو بەرەیی دەبات وەئەگەر پیاوو بەتەنگ ماڵەکەیەوە نەبێت ئەوا بەرەلایەکی گەورە سەرهەڵ دەدات لە کۆمەڵگەدا ، و ئەم جۆرە پیاوانە ناچنە بەهەشتەوە و سزای دۆزەخ دەدرێن .

## ٢٦ـ خۆ پاك نەکردنەوە لە ( میز )

ئەمەش پیشەی ئەهلی ( النصاری ) یە ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وثیابك فطهر ﴾ وەپێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێ‌پەڕی سزا دەدران وە فەرمووی یەکێکیان بەهۆی خۆ پاکژ نەکردنەوەی لە ( میز) ی سزادەدرێت ، وەئەوی تریان بەهۆی قسەهێنان و بردنەوە ) متفق علیه .

## ٢٧ـ خیانەت کردن

خیانەت کردن هەروەها لەتاوانە گەورەکانە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وان الله لا یهدي کید الخائنین ﴾ واتە پەروەردگار هیدایەتی خیانەت کارانی تەڵەکەدار نادات ، وە پێغەمبەر ﷺ ( لا ایمان لمن لاأمانة له ولا دین لمن لا عهد له ) واتە : باوەڕی نییە کەسێك کە متمانەی نییە ، وەدینی نییە کەسێك کەبەڵێنی نییە ) . ئەمەش پیشەی دووڕووەکانە خوای گەورە بمان پارێزێت لێی

## ٢٨ـ فێربوونی زانیاری بۆ مەبەستێکی دوونیا و شاردنەوەی زانیاری

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ان الذین یکتمون ما أنزلنا من البینات والهدی من بعد ما بیناه للناس في الکتاب أولئك یلعنهم الله ویلعنهم اللاعنون ﴾ ئەو کەسانەی زانیاری دەشارنەوە لەوەی کە خوای گەورە ناردوویەتی لە هیدایەت و ڕوون کردنەوە پاش ئەوەی خوای گەورەوە ڕوونی کردۆتەوە ، بۆ خەڵکی لە کتێبەکەیدا ئەوانە خوای گەورە لەعنەتیان لێ دەکات و لەعنەت لێ کراوەکانیش لەعنەتیان لێ دەکەن ، وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( من تعلم علماً مما یبتغی به وجه الله لا یتعلمه الا لیصیب به عرضاً من الدنیا لم یجد عرف الجنة

یــوم القیامــة ﴾ ابــو داود ، اوته : هــەر کەسێك زانیارییــەك فــێربێت و لەوانــەی کەرەزامــەندی خــوای گــەورەی تیــادا بەدەســت دێــت ، بــەڵام فــێری بێــت تەنــها لەبــەروە دەســت هێنانی دوونیا لەرۆژی دواییدا بۆنی بەهەشت ناکات .

## ٢٩ـ منەت کەر

منــت کــەر چــی کــارێکی چاکــەدەکات بــەهۆی منــت کردنەوەیە بەتاڵی دەکاتەوە لای پەروەدگار ، وەئەم تاوانەش لەتاوانە گەورەکانە ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ لا تبطلــوا صدقــاتکم بــالمن والأذی ﴾ واتــە : خــێرو چاکــەکانتان بەمنــەت کــردن بــەتاڵ مەکەنــەوە ، وەپێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی : ﴿ ثلاث لا یقبل الله منهم صرفاً ولا عدلاً : عاق ، ومنــان ، ومکــذب بــالقدر ﴾ الطبراني وابن عاصم ، واتــە : سیان خــوای گــەورە هیچ ڕێکیــەك و کردەوەیــەکیان لــێ وەرناگرێت ، ماف خــۆر ، منت کەر ، قەدەر بەدرۆ زان ) .

## ٣٠ـ ( سیخوڕی کردن ) جاسوسی کرد

خــوای گــەورە دەفــەرموێت ﴿ ولا تجســـــوا ﴾ واتــە : گوێمەگرن بەسەر خەڵکییەوە ، بەمەستی جاسوسی کردن بەسەریانەوە ، وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ من استمع الی

حديث قوم وهم له كارهون حب الله فی أذنيه الآنك يوم القيامة ، ومن صور صورة عذب وكلف أن ينفخ فيها الروح وليس بنافخ ﴾ رواه البخاري واته : هەر كەسێك گوێ بگرێت لە قسەی كۆمەڵێك كەپێیان ناخۆشە گوێی لێبێت خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا گوێكانی پڕ دەكات لەماددەی تواوە ، وە هەر كەسێك وێنەیەك بگرێت یان دروستی بكات لە وێنەكان لەڕۆژی قیامەتدا داوای لێ دەكرێت ڕۆحی بكات بە بەردا كەناشتوانێ ڕۆحی بەبەردا بكات .

## ٣١ـ قسه هێنان و بردن

ئەمەش هەروەها یەكێكە لەتاوانە گەورەكان خوای گەورە و میهرەبان دەفەرموێت ﴿ ولا تطع كل حلاف مهين ، هماز مشاء بنميم ﴾

وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی فەرمووی ئەمانەسزا دەدرێن بەهۆی گەورەوە سزا دەدرێن ، یەكێكیان قسەی دەهێناو دەبرد .. .. ) رواه البخاری .

## ٣٢ـ لەعنەت كردن

لەعنەت كردن كارێكی زۆر خراپە و لەتاوانە گەورەكانە جگە لەو كەسانە نەبێت خوای پەروەردگار

یـان پێغەمبــەرﷺ ئاماژەیــان کــردووە بەلەعنــەت کردنیــان پێغەمبـەر ﷺ ﴿ لعـن المؤمـن کقتلــه ﴾ متفـق علیــه واتــه لەعنـەت کـردن لـه بـاوەڕدار وەکـو کوشـتنی وایـه ، وە هــەر کەسێك بـاوەڕدار بەلەعنـەت بکـات وەکـو کوشــتبێتی وایــه وەهـەر کـەس دەیـەوێت بـاوەڕدار نـەکوژێت ئـەوا بـا نەعلـەتی لـێ نەکات .

## ٤٢ ـ حوکمی کافر کردنی موسڵمان

پێغەمبەر فەرموویەتی ﴿ من قال للاخیه یا کافر فقـد بـاء بهـا احدهمـا ﴾ رواه البـخاری واتــه : هــەر کەسێك بـه بـرای باوەڕداری بڵێت ئەی کافر ئەوا بەریەکێکیان دەکەوێت •

## ٣٤ـ بەڕاست زانینی جادوگەرو فاوەگرەوە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ من اتی عرافاً او کاهناً فصدقه بما یقول فقد کفر بمــا انـزل علـی محمـد ﴾ احمد وحاکم ، واتـه: هـەر کەسێك بچێتـه لای جادوگـەرو فـاەر گـرەوە و ئـەوەیشــی دەیڵێت بەڕاستی بزانێت ئەوا بـێباوەڕە بـەوەی دابـەزیوە بـۆ سـەر محمـد ) ئەمـه بەڵگەیــه لەسـەر ئـەوەی فـاوە گـرەوەو جادوگـەر بـێ بـاوەڕن وە تەنـها چـوون بـۆ لایـان مـرۆف بــێ

باوەڕدەكات وە بەتايبەت بەڕاست زانينيان جادووگەر هەموو ئەو بەناو شێخ و كەسانە دەگرێتەوە كاری نوشتەو فاڵ و سيحر كار دەكەن وەهەروەها ئەو كەسانەی لەبواری ( پاراسايكۆلۆجی ) كار دەكەن ·

## ٢٥ـ سەرپێچی كردنی ئافرەت له مێردەكەی يان دەرچوون لەفەرمانی پياو

خوای گەورەو ميهرەبان دەفەرموێت ﴿ واللاتي تخافون نشوزهن فعضوهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن فان اطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا ان الله كان علياً كبيرا ﴾وه پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( گەر پياو ئافرەتەكەی خۆی بانگ كرد بۆ سەر جێگا پاشان ئافرەتەكە نەچوو دوايی پياوەكە ئەو شەوە توڕبوو لەسەری مەلائيكەتەكان لەعنەتی لێ دەكەن تا ڕۆژ دەبێتەوە ) رواه البخاری ·

## ٣٦ـ ئازاردانی دراوسێ

ئازاردانی دراوسێ يەكێكە لە تاوانە گەورەكان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ لا يدخلوا الجنة من لا يامن جاره بوائقه ﴾ رواه مسلم واتە: ئەو كەسە ناچێتە بەهەشتەوە كە متمانە نەدات بەدراوسێكەی لە خراپەكانی خۆی .

## ٣٧ـ غەش کردنی پێشەوا لە ژێردەستەکانی خۆی

خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێت ﴿ انما السبيل على الذين يظلمون الناس ويبغون في الارض بغير الحق اؤلئك لهم عذاب اليم ﴾ وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ ايما راع غش رعيته فهو في النار ﴾ رواه احمد واتە : هەر پێشەوایەك غەش لەژێر دەستەکانی بکات ئەوە دەچێتە ناو ئاگرەوە ٠

## ٣٨ـ خواردن وخواردنەوە لەقاپ و قاچاخی زیو و ئاڵتون دا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ ان الذي ياكل او يشرب في اناء الذهب او الفضة انما يجرجر في بطنه نار جهنم ﴾ رواه مسلم واتە : هەر کەسێك خواردن یان خواردنەوە بخوات لە قاپ و قاچاخی زیو و یان ئاڵتوندا ئەوا ئاگری دۆزەخ لە سکیدا توند دەکرێت .

## ٣٩ـ لەبەر کردنی ئاوریشم ، ئاڵتون بۆ پیاو

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت﴿ انما يلبس الحرير في الدنيا من لا خلاق له في الاخرة ﴾ رواه مسلم واتە : ئەو کەسەی ئاوریشم لەبەر دەکات لەدونیادا لەرۆژی دواییدا هیچ پاداشتێکی بۆ نیيە .

## ٤٠ ـ زۆر ووتن و زیادە ڕەوی کردن لەشتدا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ ومن خاصم في باطل وهو يعلمه لم يزل في سخط الله حتى ينزع ﴾ رواه ابو داود ، واتە هەر کەسێك توندو تیژی بکات لە شتێکی بەتاڵدا بەوەش بزانێت بەردەوام لە توڕەبوونی خوای گەورەدا دەبێت تاوەکو وازی لێ دێنێت .

## ٤١ ـ نەترسان و گوێ نەدان لەسزای خوای گەورە

خوای گەورە و میهرەبان بەڵێنی داوە بەو کەسانەی کە کەم و کوڕی دەکەن لە کێشانەو تەرازوودا بە سزای سەخت ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ويلٌ للمطففين ﴾ ئەو کەوسانەی کە ماڵ کێشانەو تەرازوو نادەن تاوانێکی زۆر گەورە دەکەن وەسزایەکی گەورەش وەردەگرن لەسەری .

## ٤٢ ـ دڵنیابوون لەسزای خوای گەورە

خوای گەورە ومیهرەبان دەفەرموێت ﴿ أفأمنوا مكر الله فلا يأمن مكروا الله الا القوم الخاسرون ﴾ پێغەمبەر ﷺ زۆر جار دەیفەرموو ( يا مقلب القلوب ثبت قلوبنا على دينك ) پێیان وت ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ترست هەیە لێمان ؟ ئەویش

فەرمووی ﴿ ان القلوب بين اصبعين من اصابع الرحمن يقلبها كيف يشاء ﴾ رواه احمد والترمذي والحاكم في مستدركه واتە : دڵەكان لە نێوان دوو پەنجەن لە پەنجە پیرۆزەكانی پەروەدگار دەیگۆڕێت چۆن بیەوێت .بۆیە دەبێت بەردەوام باوەڕدار ترسی سزای خوای پەروەردگاری هەبێت

## ٤٣ ـ تەرك كردنی نوێژی هەینی و نوێژی جەماعەت

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ خەڵكانێك پەیدا دەبن واز لەنوێژی جەماعەت دێنن ، گەر بەردەوام بن لەسەری خوای گەورە مۆری ڕەش دەدات لەسەر دڵكانیان پاشان لە بێ ئاگاكان دەبن ﴾ . رواه مسلم

وە هەروەها فەرموویەتی هەركەس گوێی لەبانگ بێت و نەیەت بەدەمیەوە ئەوا نوێژی دروست نیە مەگەر هۆیەكی ببێت .رواه ابن ماجه وابن حبان ( من سمع النداء فلم ياتيه فلا صلاة له الا من عذر ) •

## ٤٤ ـ فێڵ و هەڵ خەڵەتاندن

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ولا يحيق المكر السيئ الآ باهليه ﴾ واتە : فێڵ و تەڵەكەی خراپ هەر دەگەڕێتەوە بۆ

خاوەنەکەی ، وەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ المكر والخديعة في النار ﴾ روا البيهقی فی شعب الايمان ، واتە فێڵ و هەڵخەڵەتاندن بکەرەکەیان لە ئاگردایە .

## ٤٥ ـ ووتەی نابەجێ ووتن بەیەکێك لەهاوەڵان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿لا تسبوا أصحابي فو الذي نفسي بيده لو انفق احد مثل أحد ذهباً ما بلغ مد أحدهم ولا نصفيه ﴾ رواه البخاری . واتە :( قسەی نابەجێ ووتن مەڵێن بەهاوەڵانم بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر یەکێك لەئێوە قورسایی کێوی ئوحد ببەخشێ ئاڵتون و زێڕ هێشتا ناگات بەئاستی ئەوان وەبەنیوەیشیان )

خوای گەورە تۆڵە بکاتەوە لە وانەی بەناوی دینەوە ووتەی نابەجێ دەڵێن بەهاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت .

## ٤٦ ـ لەخۆدان و هاوار کردن لەسەر مردوو

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ اثنتان في الناس هما بهيم كفر ، الطعن في الانصاب والنياحة على الميت ﴾ مسلم واحمد واتە : دوو شت هەیە لە خەڵکیدا تیا بوونیان کوفرە ، جوێن دان بەنەسەب ، لەخۆدان وهاوار کردن لەسەر مردوو .

لەکۆتاییدا داوا لە خوای گەورەو میهرەبان دەکەم بمانپارێزێت لەم تاوانە گەورانە و تاوانی تریش وە ئەم نوسراوەش بکاتە توێشوویەك بۆ قیامەت و وە بمانگێرێت لەو کەسانەی کە باسیان دەکات ﴿ واما الذین ابیضت وجوهم ففی رحمة الله هم فیها خالدون ﴾ ئەمانەش لەم کتێبانە وە رگیراون

کتاب الکبائر الامام الذهبي

کتاب الکبائر للامام محمد بن عبدالوهاب

محرمات استهان بها الناس للشیخ محمد صالح المنجد

( سبحانك اللهم وبحمدك واشهد أن لا اله الا انت استغفرك واتوب الیك )

# پێرست

# التحذير من

## كبائر الذنوب

كتاب الكبائر للامام الذهبي

والكبائر للشيخ محمد بن سليمان التميمي

ترجمة :

ابو ريان



ژمارەی سپاردن (١١٧)